زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (20)

# مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک


ماڵکۆڵم یاپ

و: ئاگری ئەفشین




(20) زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان

ناوی کتێب: مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك

نووسینی: ماڵکۆڵم یاپ

و. لە ئینگلیزیەوە: ئاگری ئەفشین

ساڵ: 2018

چاپ: ئەلکترۆنی

## ناوەڕۆك:

## نەخشەی کات، عێراقی کۆن

**حکومەتی شارەکان، سوومەریەکان** 3000 -2400 پ.ز

**هەوەڵین ئیمپراتۆرییەتی سامییەکان** 2400-2200 پ.ز

**بونیادنانەوەی سوومەر** 2100-2000 پ.ز

**دووەمین ئیمپراتۆرییەتی سامیەکان (بابلیەکان)** 1900-1600 پ.ز

**ئیمراتۆرییەتی ئاشووریی** 1400-600 پ.ز

**.لە ساڵی** 539پ.ز **بابل لە لایەن ئیمپراتۆرییەتی فارسەوە داگیر کرا**

## نەخشەی کات، میسری کۆن

**سەردەمی ئەوەڵ**

**خانەدانی** 1-2 3100-2700 پ.ز

**شانشینی کۆن**

**خانەدانی** 3-8 2700-2200 پ.ز

**سەردەمی یەکەمی ئاڵۆزییەکان**

**خانەدانی** 9-11 2200-2000پ.ز

**شانشینی ناوەند**

**خانەدانی** 12 2000-1700 پ.ز

**سەردەمی دووەمی ئاڵۆزییەکان**

**خانەدانی** 13-17 1780-1550 پ.ز

**شانشینی نوێ**

**خانەدانی** 18-20 1550 -1075

**بەرەو لەناوچوون**

**خانەدانی** 21-31 1075-332 پ.ز

**سەردەمی یۆنان:** 332-20 پ.ز

**سەردەمی ڕۆم:** 30 پ.ز -395ز

**سەردەمی بێزەنتیەکان:** 395-640 ز




نەخشەی ڕۆژهەڵاتی نزیکی کۆن

## دەستپێکی مێژوو لە سوومەریەکانەوە

دەڵێن کە مێژوو 3000ساڵ بەر لە زایین لە سوومەر دەستی پێ کردوو، لە ناوچەیەکی بچووك لە باشووری عێراقی ئێستا. بۆچی؟ وڵامەکەی ئاسانە: لەبەر ئەوەی خەڵکی سوومەر نووسینیان داهێنا. مێژوو لەگەڵ داهێنانی نووسین دەست پێدەکات. شوێنەوارناسان بە هۆی موتاڵاکردن لەسەر ئێسك، کەرەستە و پارچە گڵێنەکان دەتوانن شتی زۆرمان لەبارەی ئەو خەڵکانەوە پێ بڵێن کە نەیاندەتوانی بنووسن، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە ناتوانن بە زمانی خۆیان هیچمان لەبارەی ژیان و گوزەرانی خۆیانەوە بۆ باس بکەن. بەبێ بەڵگە و شوێنەواری نووسین هەرگیز ناتوانین بزانین خەڵك چۆن بیرییان کردۆتەوە یان چیان ویستووە،هەتا نازانین ناویان چیە، بەڵام ئێمە دەتوانین چاك ئەو کەسانە بناسین کە توانیویانە بنووسن؛ هەروەها دەتوانین ئەوانەش بناسین کە نووسینەکانیان بۆ بەجێهێشتوین کە بتوانین لە بارەیانەوە بخوێنینەوە. ئێمە بە ئەمە دەڵێین مێژوو.



بەلەمی خڕ لە تیگریس دەوروبەرس ساڵی 700 پ.ز

## شارەکان و شارستانیەت

لە سوومەر شتێکی تەواو نوێ ڕوویدا؛ خانوویان دروست کرد و بوونە شارنشین. بە پێی ئەو پێوەرانەی کە ئێمە پێی گەیشتیون شارەکان زۆر گەورە نەبوونە، بەڵان کۆچ کردن بۆ شارەکان واتە ڕێگەیەکی نوێی ژیان. لە یەکێك لە نامیلکەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە ( مرۆڤ و خۆراك) باس لە شۆڕشی کشتوکاڵی کراوە کە چلۆن خەڵکی پێشتر لە سەر ڕاوکردن و کۆکردنەوەی گژوگیا ژیاون و دواتر هەوڵی ماڵی کردنی ئاژەڵەکانیان داوە، بەخێوییان کردوون و بۆ خواردنی خۆیان کەڵکیان لێ وەرگرتوون.ئەمە ئەو کاتە گۆڕانکاری بەسەرداهات کە کاتێك خەڵك کۆچیان کرد بۆ شارەکان و بە هۆی کاری کشتوکاڵ کردن لەوە ئەرخەیان بوون کە لەم ڕێگایەوە دەتوانن خواردنی زۆرتریان دەستبکەوێت. دواتر بە پێی تێپەڕبوونی کات بەشێك لە ئەندامانی خێزانەکان وازیان لە کارکۆکردنەوەی خۆراك هێناو و ئەو خواردنانەیان دەخوارد کە خەڵکانی دیکە بەرهەمیان دەهێنا و خۆیان گرنگییان بە شتانی دیکە دەدا. خەڵك دەستیان کرد بە بەدەستهێنانی پسپۆڕیی لە بارەی ئەو شتانەوە کە تێیدا زۆر شارەزا بوون. شارەکان بە هۆی پسپۆڕیی خەڵکانی دیکەوە هەڵەسوڕا، واتە بەشێکی زۆری خەڵك لە کرێکار و وەستا و پیشەوەرەکان سەرقاڵی بەرهەمهێنان و کاری دیکە بوون و لە هەمان کاتدا خۆراکیشیان لە دەرەوە بۆ دەهات. خۆراك لە گوندەکانی دەوروبەر دروستدەکران و هەناردەی شارەکان دەکران. لەوێدا خۆراك لەگەڵ کاڵای دیکەئاڵوگۆڕی پێ دەکرا. بۆ ئەوەی ئەم ئاڵوگۆڕ کردنە بەدروستی بەڕێوەچووبا، پێویست بوو کە جۆرێك لە حکومەت هەبێ و ئەمەش سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەت بوو.

**نووسین، شارەکان و حکومەت: ئەم سیانە پێکەوە پێی دەوترێ شارستانیەت. یەکەم جار ئەمە لەڕۆژهەڵاتی نزیکیکۆن دەستی پێکرد.**

## رۆژهەڵاتی نزیکی کۆن

**ڕۆژهەڵاتی نزیك لە میسرەوە درێژ دەبێتەوە تا ئێران(خاکی فارسی ئەوکات). لەوانەیە سەیر بێت کە شارستانیەت لەوێدا سەری هەڵدابێت، چونکە سەرچاوەی سروشتی کەمی هەبووە و لە وەرزی هاوین ئەم ناوچەیە زۆر گەرم و ناخۆشبووە هەندێ لە مێژوونووسان پێیان وایە کە ژیان لەم ناوچەیە سەختە؛ کە بۆ یەکەم جار شارستانیەت لەوێدا دەستی پێ کردووە، ئەم سەختیە وای لە خەڵك کردووە کە ڕێگەی نوێ بدۆزنەوە بۆ ژیان، بەتایبەت بۆ ئەو ناوچانەی کە کۆکردنەوەی خۆراك کارێکی ئاسانتر بووە.**

**جوگرافیای ڕۆژهەڵاتی نزیك دابەش دەبوو بۆ دوو بەش؛ چیاکانی باکوور و بیابانەکانی باشوور. ئەم دوو ناوچانەبە هۆی ڕووباری گەورەوە بونەتناوچەی بەپیت. ئەم ناوچە بەپیتانەش دەکەونە عێراق و میسر. ئەم ڕووبارانە واتە دیجلەو فورات بە خاکی عێراقدا تێدەپەڕن و لە باشوورەوە بە چیاکاندا تێدەپەڕن و لە کۆتاییدا دەڕژێنە کەنداوی فارسەوە. ڕووباری نیلیش بە میسردا تێدەپەڕێ و لە باکوورەوە بە چیاکاندا دەڕوا و تا دەڕژێتە ناو دەریاچەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەفریقا و لە کۆتاییدا بۆ مەدیتەرانە. ئەم ڕووبارانە بوونەتە هۆی پیتی خاکەکەی، کە لەوێدا ڕووەکەکان بە باشی ئاودێریی دەکرێن و گەورە دەبن.**



**دارخورما لە ئێراق**

## عێراقی کۆن

**زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر هەندێك لە جوتیارەکانی سەردەمی بەردینی نوێ دەستیان کرد بە کۆچ کردن لە دۆڵەکان بۆ دەشتەکانی عێراق، ئەمە لەخۆیدا گۆڕانکاریەکی گەورە بوو. لە چیاکان بەهۆی ڕێژەی باران بارینی زۆر گژوگیا چاك گەورە دەبوون، بەڵام لە ناوچە دەشتاییەکان باران بە پێی پێویست نەدەباری. جوتیارەکان فێربوون بۆ کاری کشتوکاڵی چۆن سوود لە ڕووبارەکان وەربگرن: ئەویش لە ڕێگەی هەڵکەندنی**

دێراو بۆ ئاوەدێری کردنی زەوو زارەکانیان و هەروەها لە بەهار و سەرەتای هاوین ئاویان لە گۆماوەکاندا کۆدەکردەوە، لەبەرئەوەی هاوینان ئاوی ڕوبارەکان کەمی دەکرد، کارێکی ئەستەم بوو، کاتێك لافاو دەهات کارەساتی گەورە ڕوویدەدا و خەڵکی تووشی برسیەتی دەبوون، بەڵام ئەگەر توانیبایان کۆنترۆڵی ڕووبارەکان بکەن ئەوا بەرهەمەکانیان چەند بەرامبەر زیادی دەکرد، لەبەرئەوەی زەویەکانیان بە پیت بوون. کە بە جۆرێك یەك کیلۆ جۆ بەرهەمەکەی لە کاتی درەو کردن دەبووە 89کیلۆ. لە هەمان کاتدا ڕوبارەکان ماسیەکی زۆریان هەبوو بۆ خواردن لە باشۆریش بە شێوەیەکی فراوان خورما هەبوو. بە پێی سیستەمێکی ڕێکخراوەیی و دروست، خواردنی پێویست بەدەستدەهات بۆ ئەوەی شارستانیەت دروست بێت.

## سوومەر

هەوەڵین شارستانیەت لە عێراق لە سوومەر بوو. سوومەریەکان کارەکانی خۆیان لە سەر لەوحەی گڵین دەنووسی لە کاتێك پارچە گلینەکان تەڕ بوون بە قامیش لەسەریان دەنووسینەوە، دواتر سوور دەکرانەوە بۆ ئەوەی ووشك بنەوە، ئیتر نووسینەکان بۆ هەمیشەیی دەمانەوە بە بێ ئەوەی هیچ زیانێکیان پێ بگات. بێگومان ئەوان ئەم نوسینانەیان بۆ ئێمە جێ نەهێشتووە، ئەوان بۆیە ئەمانیان پاراستووە، چونکو لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان، لە کاروباری بازرگانی و بڕیاری یاسایی پێویستیان پێ هەبوونە. هەندێك لەم نووسینانە نامیلکەی قوتابخانەن ڕێگای ئەم لەوحانەوە ئێمە دەتوانین وێنەیەك لە مێشکی خۆمان دروست بکەین کە بزانین سوومەریەکان چۆن ژیاون. ئەوان لە شارێکدا ژیاون کە تێیدا حکومەتداری دەکرا، لە ناوەڕاستی هەموو شارەکان پەرەستگایەك هەبوو و هەروەها کۆمەڵە بینایەکیشی لێ بوو کە خەڵکی تێیاندا کاریان دەکرد. گەورەترین پەرەستگای سوومەریەکان پێی دەوترا زیگورات (واتە: چوونە سەرەوە بۆ ئاسمان)ئەم پەرەستگایە لە خشتی گڵین دروستکرابوو، کە خشتەکان یەك لەسەر یەك هەڵچنراون و بەرزییەکەی دەگاتە 30مەتر بەڵکو زیاتریش. پەرەستگاکە لە لایەن پیاوانی ئاینی، نووسەرانی دەربار و یان ئەوانەی دەچوون نووسین فێر ببن، بەڕێوە دەچوو. لە چواردەوری پەرەستگاکە جایەك لێ بوو کە کرێکار و پیشەوەرکان تێیدا کاریان دەکرد و دەژیان. دواتر سەنگەری لێ دروستکرا بۆ پارێزگاری کردن، هەروەها ئیدارەی حکومەتیشی لێ دروستکرا. ئێمە ئەم هەمووە زانیاریانەمان لە لایەن نووسەرانی دەربارەوە دەست کەوتووە، کە ئەوان پەیوەندییان لەگەڵ پەرستگاکاندا هەبووە و زانیاریەکانیان نووسیونەتەوە.

## بەڵگەنامەکان

لە ڕاستیدا ئەوە پیاوانی پەرەستگا بوون کە بوونە هۆی ئەوەی هەموو ئەم نوسینانە پارێزراو بن و هەرئەمەش ڕێنماییمان دەکات بۆ خاڵێکی گرنگ، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە کاتێك لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی دەکەین دەبێ بپرسین کە ئاخۆ کێ ئەم زانیاریانەی نووسیوە و بۆچی نووسیونی. بەڵگەنامەکانی سوومەریەکان زۆربەی جار لە لایەن پیاوانی ئایینیەوە نوسراونەتەوە ئەویش بۆ ئامانجی خۆیان. بەهۆی خوێندنەوەی ئەم زانیاریانە دەکرێ لەوە تێبگەین کە سوومەر لە لایەن پیاوانی ئاینیەوە بەڕێوەدەچوو. هەندێ لە مێژوونووسان پێیان وایە کە سوومەریەکان وابیریان کردۆتەوە کە  هەموو شارەکان و وڵاتەکان پەیوەستە بە خواکان و لە لایەن پیاوانی

ئاییینەوە حوکمڕانی دەکرانبەڵام ناتوانین بە تەواوی لەمە دڵنیا بینەوە، بەڵکوو وڵات لە لایەن کەسانی دیکەوە بەڕێوەبراوە کە نەیانتوانیوە بنووسن و ئێمەش لەبارەیانەوە نازانین.



وسراوێك لە سەر لەوحێکی گڵین کە فەرمانەکانی پاشا نیشان دەدات

# کانزا و بازرگانی

پیشەوەرە سوومەریەکان زیاتر کاریان لەسەر دار و کانزا کردووە گرنگترین کانزاکان بە کردەهاتن بۆ دروستکردنی چەك و کەرستەی پێویست. کە لە سەرەتا سوود لە مس وەردەگیرا (تێکەڵەیەك لە مس و قەڵایی) و دواتر سوود لە برۆنزیش وەرگیرابەڵام سوومەریەکان خۆیان هەرگیز نە درەختیان هەبوو نە مس و نە قەڵایی. هەمو ئەمانە لە چیاکانی باکورەوە دەهێنران. وومەریەکان بە شێوەیەکی فراوان گرنگیان بە دروستکردنی کارخانەی بەرهەم هێنانی پارچە دەدەا و دواتر ئەم بەرهەمەی خۆیان هەناردە دەکرد بۆ ئاڵوگۆڕکردنی کاڵاکان. بەم پێیە بەرفراوان بوونی پسپۆڕی لە پیشەوەری، وای لە کاری بازرگانی کرد ببێتە شتێکی پێویست. گۆنگۆووبارەکان لەوەدابوو کە کاری بازرگانی ئاسانتر کردبوو ئەویش بە هۆی کەڵك وەرگرتن لە کەشتی بۆ گواستنەوەی کوڵەلەکان. چینێکی بازرگانی دروست بوو بۆ گواستنەوەی کاڵابازرگانیەکان، بازرگانەکان تەنها سەروکاریان لەگەڵ گواستنەوەی کاڵاکان نەبوو بەڵکۆ بیرۆکەنوێشیان داهێنا. خەڵکی عێراق دەستیان کرد بە دروستکردنی هەوەڵین سیستەمی کێش و پێوانە وئەمەش کارێکی ئاسانتر بوو بۆ بەڕێکردنی کاروبارەکان بە شێوەیەکی خێراتر و دەقیقتر، کە بە شێوەیەکی دروست کێش و پێوانەی ئاڵەت و زێڕ و زیویان دەکرد. دواتردەستیان کرد بە پەرەپێدانی سیستەمی پارە.



مۆدێلێکی نوێژەنکردنەوەی زیگوورات لە ئوور

# ئاشوریەکان و بابلیەکان

تاکوو ئێرە هەندێك لەو پەیوەندیانەمان بینی کە لە نێوان دانیشتوانی کەنار ڕووبارەکان و ئەو خەڵکانە هەبوو کە لە چیاکان بوون. گروپسێیەم کە زۆر گرنگ بوون لە مێژووی عێراقی کۆن ئەوانە بوون کە لە بیابانە فراوانەکان دەژیان کە لە عەرەبستانەوە درێژ دەبێتەوە تا خاکە بە پیتەکانی نێوان عێراق و سوریا. ئەمانە خەڵکانی دەشتەکی یاخود عەشیرەت بوون کە بزن و مەڕوماڵاتیان هەبووو ئاژەڵداریان دەکرد لە لەوەڕگا و قەراغ ڕووبارەکان. ئەم خەڵکانە زۆر هێز و شەڕانگێز بوون و توانیان دەست بگرن بەسەر شارەکانی سوومەر و هەموو ناوچەکانیان خستە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆیان. خەڵکی ئەم حکومەتە نوێیە بە زمانی ئەکەدی قسەیان دەکرد. ئەم زمانە جیاواز بوو لە زمانی سوومەریەکان ئەم زمانە نوێیە یەکێك بوو لە زمانە سامیەکان هەروەکوو عیبری و عەرەبیەڵام ئەکەدیەکان لاسایی بەشێکی زۆری ژیانی سوومەرەیکانیان دەکردەوە بەتایبەتی ڕێگاکانی ئەوان لە نووسین. لە ڕاستیدا ئێمە فەرهەنگمان لەبەردەستدایە کە ئەوان کۆیان کردۆتەوە بۆ یارمەتیدانیان لە کاتی نووسین.



پەیکەرێکی ئاشووریەکان, نەمرووود

ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی هەمیشە لە هەڵکشان و داکشاندابوو. دواتر ئەکەدیەکان پەلیان هاویشت بۆ دەرەوەی سوومەر و بەروە باکوور پێشڕەوویان کرو پایتەختی خۆیان دروست کرد کە بابل و نەینەواشی دەگرتەوە (پایتەختی ئاشوریەکان). بەهۆی مێژوو ئەو دەستنووسانەی کە لە پاشای بابلی و ئاشوریەکان لە دوای خۆیان جێیان هێشتووە و هەروەها لە ڕێگای نووسینەکانی یەهودی و یۆنانیەکانەوە، ئێمە زانیاریەکی زۆرمان لە بارەی ئەو ئیمپراتۆریەتانەوە هەیە، بەڵام لێرەدا زۆر گرنگ نیە بۆ ئێمە کە وردەکاری جەنگەکانیان بزانین. زیاتر گرنگی بەوە دەدەین کە ئیمپراتۆریەتەکانیان چۆن بوونە.

## حکومەت

ئێمە زۆر لەوە دڵنیا نین کە شارەکان لە سەرەتادا چۆن حوکمڕانی کراون. ئەگەری هەیە لە لایەن پیاوانی ئاینیەوە بەڕێوەچووبن، یاخود لە لایەن هەندێلە پیاوانی گرنگ لە دانیشتوانی ئەو شارانە حوکمڕانی کرابن.لەو سەردەمە زۆر لایەن هەوڵیان دەدا بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵات کە پێی دەوترا لۆگاڵ: (ئەمەش نازناوێك بوو کە دەدرایە حاکمی دانیشتوانی سوومەرەیەکان و بەرزترین پلە بوو، بە زمانی سوومەری واتە پاشا).لە ئەنجام لە گەڵ هاتنی ئەکەدیەکان دەسەڵاتی پاشا بە خێرایی زیادی کرد تاکو گەیشتە ئەو ئاستەی سوپای بەهێزیان دروست کرد، هاوشێوەی حکومەتێکی گەورەی بیرۆکراسی. ئەم داگیرکاری و بەرفراونکردنەی دەسەلات لە لەوحەکاندا نوسرانەوە کە پاشاکان شانازیان بە دەسەڵاتی خۆیانەوە دەکرد.

## سوپا

لە سەرەتا سوپاکان زۆر بچووك بوون، بە بۆچونێکی زۆر پیاوانی سوپا لەو کەسانە پێك دەهاتن کە لە هەموو شارەکان کۆدەکرانەوە کە گونجاو بوون و توانای جەنگیان هەبووە. جەنگەکان هەمیشە بە پێی پیادە بووە و تەور و نەیزەکیان بە کار هێناوە. ئەم جۆرە سوپایە لە سەردەمانی داهاتوو زۆر سوودی نەبوو، بە تایبەت بۆ ئەو پاشایانەی کە هەوڵی داگیرکردنی باکوور و سوریاو هەتا میسریشیان دەدا. بۆ سەرکەوتنیان لە داگیرکاری پێویستیان بە سوپای لێهاتوو هەبوو و بەتایبەت بەکرگیراوی دەرەکی و فەرماندەی لێهاتوو.

کەم کەم سوپاکان لێهاتووتربوون و زیاتر پڕچەك کران و گەورەتریش بوون. یەکێك لە گەورەترین گۆڕانکاریەکان کە ڕوویدا لە ساڵانی 1500پ.ز عارەبانەی جەنگی دروستکرا. بەرلەو سەردەمە عارەبانە جەنگیەکان زۆر قورس و قەبەو چەرخەکانیشی چەسپاو بوون واتە دەبوایە بە هۆی گاو شتی دیکەوە گواسترابانەوە بۆ مەیدانەکانی جەنگ، ئەویش چونکە زۆر بە خاوی ڕادەگوێسترا، کاتێکی زۆری دەویست، بەڵام دواتر بە هۆی دروستکردنی عارەبانەی چەرخدار، عارەبانەکان بە خێرایی دەگواسترانەوە و زۆریش سوودیان لێ وەردەگرتن بۆ جەنگەکان، ئەم عارەبانانە بە هۆی ئەسپەوە دەگواسترانەوە و وێرانکاری زۆریشیان لە جەنگدا دروست دەکرد. دواتر تەقریبەن ساڵی (1000پ.ز) سەربازەکان لە پشتەوەی ئەسپەکان واتە لە سەر عارەبانەکان دەجەنگان. ئیتر کەم کەم وای لێهات ئەسپ سواری شوێنی عارەبانەشی گرتەوە. چەکێکی دیکەی بەهێز کە

**دروستکتیروکەوان بوو کە لە پارچە دارێکی چەماوە دروستدەکرا، و تیرەکانی مەودایەکی زۆریان دەبڕی تا خۆیان دەگەیاندە زرێ پۆشەکان. لە کۆتاییدا چەکە سادەکانی وەکوو نەیزەك و تەور و شمشێرش گۆڕانکاریان بەسەرهات. لە چیاکانی باکوور لە ئاناتۆلیا کە خەڵکی ئەو شوێنەی پێیان دەوترا (هیتیەکان)، توانیان ڕازی بەکارهێنانی کانزای پتەوتری وەکوو ئاسن بدۆزنەوە. لە سەرەتادا ئەم ڕازەیان بە نهێنی لە نێوان خۆیان هێشتەوە، بەڵام دواتر بەرەبەرە تا ساڵی 1200پ.ز ئەم ڕازە بە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا بڵاو بوویەوە. دواتر ئاسن کەڵکی لێ وەرگیرا بۆ زۆر کاری خزمەتگوزاری، بەڵام زیاتر بۆ جەنگ بەکاردەهات. چونکە ئاسن لە برۆنز پتەوتر بوو.**

**ئاشووریەکان و بابلیەکان لە دەوروبەری 600پ.ز سوپای زۆر بە توانا بوون ئەویش بە هۆی فەرماندەی لێهاتوو، سەربازانی ئازا، عارەبانەی جەنگی و دروستکردنی چەکی نوێ. کتێبی پیرۆز شتی زۆرمان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەمانەوە. ئەم جۆرە سوپایانە دەتوانن ئیمپراتۆریەتی گەورە دروستبکەن و ناوچەی زیاتر داگیر بکەن. ئەوان ئەم جۆرە ئیمپراتۆریەتەیان بە پێویست دەزانی. لەبەرئەوەی سەربازەکان پێویستیان بە پارە و بژێوی هەبوو، ماڵیاتی زیاتریان لە خەڵك وەردەگرت، یاخود لە ڕێگای تاڵانکاری و داگیرکاری زیاتر ئەو پارەو بژیویانەیان دەستەبەر دەکرد. بەکورتی ئەم سەردەمە سەردەمی توندوتیژی و داگیرکاری بوو.**

## یاسا

**خەڵکی عێراق بۆ ئەوەی توانیبایان پێکەوە لە ئیمپراتۆریەتێکی وەکوو سوومەریدا بژین، پێویستیان بە یاسا هەبوو. یەکەم جار لە سوومەر بوو کە یاسا دەرچوو، کە کۆمەڵە یاسایەك بوون دواتر لە لایەن فرمانڕەواکانی دیکەوە برەوی پێدرا. گەورەترین و بەناوبانگترین کۆمەڵە یاسا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بابلیەکان بوو کە بە یاساکانی حامورابی (1792-1750پ.ز) ناسراوە. زۆربەی یاساکانی ئەو، یاسایی مەدەنی بوون، یاساکان زیاتر لە بارەی کاروباری خێزان، مافی زەوی و زار و بازرگانی بوون. هەندێکیش لە یاساکان لە بارەی تاوانکارییەوە بوون. دەکرێ لە ڕووی ئەم یاسایانەوە شتانێکی زۆر لە بارەی کۆمەڵگای ئەو سەردەمەوە بزانین. خەڵك یەکسان**



**سێوازی سەربازانی ئاشوری**



یمەنێك لە ڕووباری نیل

نەبوون، ژنان بارودۆخیان خراپ بووە تایبەت لە سەردەمەکانی دواتر. نەجیبزادەکان مافیان هەبوو، بەڵام خەڵکی هەژار هیچ مافێکیان نەبوو.

## پەروەردەو فێربوون

ئامانجی سەرەکیان لە خوێندن، فێربوونی نووسین بوو؛ تەنها پیاوان بوونکە دەیانتوانی بخوێننەوە و بنووسنەوە و لە پەرەستگا خزمەت بکەن، یان لە کۆشك و لە دادگا سەرقاڵ بن یاخود ئەوەی کەکاری بازرگانی بکەن. لە ناو پیاوەکانیش تەنها ڕێژەیەکی کەم بوون دەیانتوانی بخوێننەوە و بنووسنەوە. هەروەها ژمارەیەکی کەمیش بوون، کە توانیان بچن لە بەشەکانی دیکەش بخوێنن؛ وەکوو بیرکاری بۆ کاری ژمیریاری و کاروباری ڕۆژانەیان، ئەستێرەناسی بۆ پێشبینی کردنی دوارۆژ.

## میسری کۆن

ڕووباری نیل لە زۆروەوە هاوشێوەی ڕووباری دیجلە و فوراتە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ جیاوازی گرنگیان هەیە. ڕووبارەکانی عێراق هەموویان ڕووباری مەترسیدارن بەتایبەتی بۆ لافاو کە وێرانکاری زۆر لە ناوچە دەشتایەکان دەکات. بۆیە کۆنتڕۆڵ کردنی کارێکی ئەستەم بوو، بەڵام ڕوباری نیل ئارامترە. هەموو ساڵێك لە نێوان مانگی حەوت بۆ دە لافاو دەست پێ دەکات. ئاوەکە بە ناو زەوییە کشتوکاڵیەکاندا تێدەپەڕێ، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ناو ڕووبارەکە. لە زەوییە کشتوکاڵیەکان تۆو دەچێنرا و لە سەرەتادا بەدەست ئاوەدێری دەکران، بەڵامتروشادۆفیان بەکاردەهێنا (شادۆف: ئامرازێکە بە کاردێت بۆ گواستنەوەی ئاو بۆ ئاوەدێری کردن کە یەکەم جار لە لایەنعێراقیەکانەوە کەو هات (وێنەکەی سەرەوە))، ئەم شادۆفە سەتڵێکی هەیە کە لە بنکەی درەخت دروستکراوە و لە سەر شوێنێکی نەجوڵاو دادەنرێ واتە سەڵەکە لە سەر شوێنێکی جیگیر دەسوڕایەوە. بە هۆی بەکارهێنانی شێوازێکی سێگۆشەیی یەك کەس دەتوانێ 4500 لیتر ئاو لە ڕۆژێکدا هەڵێنجێ. بەرهەمە دانەوێڵەکانی وەکوو گەنم و جۆ هەڵدەگیرانەوە بەر لەوەی لافاوی داهاتوو دەست پێ بکات، لەم ڕێگایەوە زۆربەی



**شادۆف**

ارەکان لە مانگە ساردەکانی زستان ئەنجام دەرا، بە پێچەوانەی عێراق کە چاندن و دروێنەش بە درێژایی هاوین ئەنجام دەدرا. تەنیشتەکانی ڕووباری نیل لە چاو خودی ڕووبارەکە بەرزتر بوون ئەمە ئاسانکاری بوو بۆ ژیان و گوزەرانی خەڵکی هەروەها ئاسانیش بوو بۆ هەڵاتن لەکاتی لافاو و شتی وا. گەرچی لەو سەردەمانە قات و قوڕی دەهات لە میسر، بەڵام لە عێراق بەو ڕادەیە خراپ نەبوو. میسریەکان لایەنی باشەی تریشیان هەبوو. بە درێژایی کەنارەکانی ڕووباری نیل بەردی لێ بوو کە بەکاردەهاتن بۆ دروست کردنی خانوو، ئەم بەردانە زۆر باشتر بوون لە خشتە سوورەکانی عێراقکە خۆیان دروستیان دەکردن.

ژیان لە میسر تا ڕادەیەك ئاسانتر بوو، ئەویش لەبەرئەوەی لە میسر شتەکان لەسەر خۆ گۆڕانیان بەسەر دەهات بە بەراوەرد لە گەڵ عێراقدا. گەرچی میسریەکان ناچار بوون لە گەڵ وڵاتانی دیکەش بازرگانی بکەن، بەتایبەت لە بەدەستهێنانی دار، بەڵام نەیانتوانی ئەم بازرگانیە وەکوو عێراق بەرفراوان بکەن، و هیچ کات دەستەی بازرگانیان نەبوو. بە خێرایی بیرۆکەی نوێیان وەرنەدەگرت، زۆرێك لە گۆڕانکاریە گەورەکان لە دەرەوە دەهاتنە میسر، هەروەها میسریەکان زۆر خاو بوون لە گۆڕینی برۆنز بۆ مس و لەوەش خاوتر بوون لە کاتی گۆڕینی برۆنز بۆ ئاسن. هەروەها سیستەمی یاسادانانیشیان لە چاو عێراق ئەوەندە خێراو لەپێش نەبوو، ئەوان شتێکی هاوشێوەی وەکوو حامورابیان نەبوو لە میسر. پەروەدەو فێربوون لە میسریش هەر وەکوو عێراق بوو، بەڵام وەکوو عێراق پێشکەوتوو نەبوو لە بواری خوێندنی زانستەکانی دیکەی بیرکاری و ئەستێرەناسی. لە بواری سیستەمی نووسین زیرەکانە کاریان دەکرد، بەڵام وەکوو عێراق بە خێرایی گەشەی نەدەکرد. هەر دوو سیستەمەکە لەوەڕا دەستیان پێکرد کە وێنەیان لە سەر شتەکان دەکێشا، بەڵام عێراقیەکان بەخێرایی دەستیان کرد بە نووسینی فۆنەتیکی ئەلف و بێ، کەهەریەك لە نیشانەکان یان پیتەکان پەیوەست بوون بە دەنگێك نەك

وێنەکەی بەڵام میسریەکان ئەم کارەیان بە شێوەیەکی سنووردار ئەنجام دا. ئەنجامەکە ئەوەبوو کە سیستەمی میسری زیاتر [illegible] بوو و ئەمەش ببوە زمانێکی سەخت لە بەکارهێنانی بۆ وەرگرتنی بیرۆکەی جێگیر.




تابلۆیەك بە سێ زمان لە سەردەمی میسرییە کۆنەکان. ئەو بەشەی‌سەرەوە ئەوەنیشان دەدا کە وشەکان بە وێنە کێشراون.



کۆنترین هەرەم هەرەمی‌پلەکانەیی لە ساکارا.

## بیناسازی و پیشەسازی

میسریەکان بێ وێنە بوون لە کاری بیناسازی و پیشەوری، بە هۆی سوود وەرگرتنیان لە زێڕ و کانزاکانی دیکەی وەکوو دار و مس کە باشترین ئامراز و کەرەستەیان لێ‌ دروست دەکرد. بە هۆی بەکارهێنانی بەرد باشترین و بەهێزترین بیناکانی جیهانیان دروست کردووە. لە نزیك پایتەختی میسری کۆن (مێنف) و لە نزیك قاهیرە گۆرستانی گەورە هەیە کە بە هەرەمەکان ناسراون،کە لە ساڵی 2700پ.ز دروست کراون. دوورتر لە باشوور لە ایتەختی دواتری تبس، شاری مردووەکانی لێیە. لە نزیك کارناك، پەرەستگایەکی گەورەی لێ یە.

میسریە کۆنەکان بۆ دروست کردنی ئەم بینایانە لە ڕووی بەکارهێنانی ئامرازەوە هیچ پێشکەوتنێکیان بە خۆوە نەدیبوویاخود تەکنیکی نوێیان بەکارنەدەهێنا. بەڵکو ئەوان ئەم کارەیان بە هۆی هێزی مرۆیی یەکجار زۆر و سەبرێکی زۆر ئەنجام دەدا. بۆ دروست کردنی هەرەمەکان کاری تاقەت پرووکێنیان ئەنجام داوە، کە پارچە بەردی زۆر گەورەیان دەخستە سەر چەند دارێکی خڕ و بە گوریسی بەهێز بەرێژایی ڕووباری نیل بەهۆی چەندین پیاو ڕادەکێشرا لەگەڵ هەوراز و نشێوی زۆریان دەکەوتە پێش تا بەردەکەیان دەگەیاندە شوێنی مەبەست. گەورەترین هەرەم پێك هاتووە لە 2300000پارچە بەرد، کە کێشی هەریەکەیان 2.8تۆن دەبێ. ئەم هەرەمە لە ماوەی 23ساڵدا دروستکراوە، بە شێوەی مام ناوەند لە ڕۆژدا 300 بەرد براوە، گواستراونەتەوە و جێگیر کراون.



ئەبولهول ؤ هەرەمی گەورەی



پەرەستگای كەرناك



دۆڵی مردن له تبس

## حکومەت

کارکردن و دروستکردنی ئەم جۆرە بینا و هەڕەمە زەبەلاحانە نیشانەی ئەوەیە کە میسریەکان پێشکەوتنیان بە خۆوە دیبوورێگایەکیان وەدیهێناوە بۆ سازمللن بە خەڵکی و بۆ ئامانجی ئاشتی خوازیانە بە ڕادەیەکی زیاتر لە چاو کۆمەڵگاکانی دیکەی ئەو کاتە. بە وتەیەکی دیکە حکومەت بە هێزتر ببوو. میسری کۆن چ جۆرە حکومەتێکی هەبوو؟ لە سەرووی حکومەت پاشا هەبوو (کە پێی دەوترا فیرعەق) بە پێی تیۆری، فیرعەونەکان زۆر بەدەسەڵاتر بووولە چاو فەرمانڕەواکانی عێراق، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەوان خۆیان بە خوا دەزانی و هەموو شتێکیان بە موڵکی خۆیان دەزانیبەلاّم بێ گومان لە کرداردا فیرعەونەکان نەیانتوانیوە هەموو شتێك بکەن. کارەکان لە لایەن بیکۆاسیەتی بەهێز، و پیاوانی ئایینی بەڕێوەدەچوون. ئەویش لۆێر بەڕێوەبەرایەتی سەرۆك وەزیرانێك. کاربەدەستەکان یاساکانیان دەردەکرد، و ماڵیاتیان کۆدەکردەوە، کاروباری ئاسایش و بیناسازیش هەر ئەوان کۆنترۆڵیان دەکرد.  زۆربەی ئەو زانیارانەی کە لە بارەی میسیە کۆنەکانەوە دەستمان کەوتوون، ئەو نووسراوانەن کە لە قەبرەکاندا دۆزراونەتەوە و لەسەر بەردیان لە کاغەزی لول کراو نوسراونەتەوئەگەر تەماشای ژیانی مردووەکان بکەین، یان ئەگەر تەماشای ئەو کاتە بکەین کەمردووەکانیان ناشتووە، سەرت دەسوڕمێ. ئەمە یەکێکە لەاکە سەیروسەمەرەکانی میسریە کۆنەکان. میسریەکان هەم کات و هەم پارەیەکی زۆریان خەرجی مردووەکانیان دەکرد. ئەو قەبرانە بە شێوەیەکی گەورە و ڕازاوە دروست دەکران بۆ ئەوەی بە شکۆمەندی بمێننەوە. هەندێ جار لە دوای بەخاك ئەسپاردنیان، قەبرەکان دەدزران. یەکێك لەو ەقبرانەی کە بە سەلامەتی دۆزرایەوە گۆڕی توت عنخ ئاموون بوو کە نزیکەی 1300کگم زێڕی تێدابوو. زۆر سەیرە، خەزێنەکانی ناو قەبرەکە دیار نەمان، بەلاّم لاشەی پاشا هەر مابوو، چونکە ئەو مۆمیای کرابوو. (مۆمیا: ئەو کاتەی لاشەکان بە دەرمانی تایبەت مۆمیای دەکرێن بۆەوەی بە پارێزراوی بمێننەوە). مۆمیایی زۆرێك لە

پاشاکانی میسر دۆزراونەوە و پارێزراون. دەتوانی زۆرێك لەو کەسانە لە پشت شووشەکانی مۆزەخانەی میسر ببینی کە سەردەمانێك دەسەڵاتدار و پاشا بوونە. بەرێژایی شانشینی نوێ (1550-1075 پ.ز) ئەمە بووژانەوەی دەڵەتی میسری بوو کە پێشتر لە لایەن پاشاکانی عێراقەوە فەرمانڕەوایی دەکران، واتە لە لایەن هیکسوسەکان. میسریەکان زۆرێ لە هیکسۆسەکانەوە فێربوون (پاشایانی شانشینی نوێ سوودیان لە تاکتیکی نوێی جەنگی وەرگرت وەکوو عارەبانەی جەنگی) و هەروەها سوپایەکی گەورەی ڕێکخراویان دروست کردبوو کە سەربازەکان بە ڕیز بە ناو سوریادا دەڕۆشتن، کاتێ کە لە گەڵ هیتیەکان دەجەنگان،بەڵام سەردەمی شانشینی نوێ سەردەمێکی ناوازە بوو. زۆربەی پاشا میسریەکان وایان بە باشتر دەزانی لە وڵاتانی خۆیان بمێننەوەو پارێزگاری لە سنوورەکانی خۆیان بکەن، هەورەها سەردەمێکیش بوو کە پاشاکانی میسردەسەڵاتیان لاوازتر ببوو. بە زۆری پاشا دەسەڵاتدارەکانلە میسری سەروو بوون، ناوچەیەك لە باشووری قاهیرە. لە باکوور، لە دەلتا لە میسری خواروو، بۆ پاشاکان زۆر ئەستەم بوو کە بتوانن دەسەڵاتیان بپارێزن. هەیێ پارێزگا سەربەخۆییان وەرگرتبوو کە فەرماندار و نەجیبزادەکان بەڕێوەیان دەبردن، لە بیابانەکانیش ئەستەم بوو بتوانرێ عەشیرەتەکانی ئەو ناوچانە کۆنترۆڵ بکرێ. ناتوانین حکومەتی کۆنی ئەوکات لە گەڵ حکومەتی ئێستا بەراوەرد بکەین.


ڕامسۆسی دووەم، پاشای میسر لە شانشینی نوێ

## ڕۆژهەڵاتی نزیکی کۆن لە مێژووی جیهان

شتانێکی زۆر هەن کە ئێمەلە بارەی مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك نایانزانین لەبەرئەوەی ئێمە دەبێ وریا بین نەك دڵنیا بین لەبارەی ئەوەی کە میسریەکان و عێراقیەکان چۆن بیریان کردۆتەوە وچیان کردووە، بەڵام ئەوەی کە ئێمە لە بارەی ئەم خەڵکەوە دەیزانین ئەوەیە کە ئەمانە بناغەی شارستانیەتیان دامەزراندووە. لە بواری سیاسەتیش ئەوان حکومەتیان دروست کرد، هەروەها پاشایەتی، بیرۆکراسی، سوپای لێهاتوو و بەهێز و هێزی پۆلیسیان پێك هێنا. لە ژیانی کۆمەڵایەتیش ئەوان هەوەڵین شارەکانیان بونیاد نا؛ هەروەها ڕێکخراو و سیستەمی ئایینی گەورەیان دروست کرد؛ هەوەڵین سیستەمی یاسایان دروست کرد؛ هەوەڵین قوتابخانەیان دروست کرد؛ دەستیان بە زانست ڕاگەیشت. لە ڕووی بازرگانیشەوە هەوەڵین سیستەمی ڕێکخراوەیی و پارەیان نیلو نا. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە نووسین و زەبت کردنیان داهێنا. خەڵکی ئەو سەردەمە ئەم کارانەیان ئەنجام دا لەبەرئەوەی گەورەترین بڕیاریان دا بۆ هەڵبژاردنی شتەکان کە بە هۆی شۆڕشی کشتوکاڵیەوە مسۆگەر کرابوون. گۆڕانکاریەکان لە ناوچەکانی دەوروبەری ڕووبارکان ڕوویان دا، چونکە ئەو ناوچانە بارودۆخی لەباریان هەبوو بۆ بەرهەمهێنانی خۆراکی زیاتر. هەروەها ئەو ناوچانە ئاسانتر بوو بۆ ئەوەی پێویستیەکانی

خەڵك دەستەبەر بكرێن. هەروەها لە ڕووباری زەردی چینیش بە هەمان شێوە بوو، هەروەها ڕووباری  گەنگیش لە هیندستان هەروەك ئیندووس لە پاكستان كە لە شارستانیەتە كۆنەكانی دیكە دەتوانین بیانبینین.



عەرەبانەكەی **توتعنخ ئامون**



مۆدێلی سەربازانی میسر ساڵانی 1900 پ.ز